ڕووداوێکی شوومی

ئوتومبیلدا لێرەدا کەوت بە دەمدا

نیشتمان: ئا... ئا... شتێکی وام لە بیرە!

دووەم: ئەتناسی؟

نیشتمان: ئەی چۆن... ئەی چۆن... سەردار سەوز

ناڵێن؟!

یەکەم: (پێئەکەنێ) دەفەرمووا! سەرداری چی؟!

سەروەت... سەروەت

نیشتمان: ئا... ئا... ببوورن... بە ڕاستی

ئەوەندە سەرم

قاڵە خەریکم ناوی خۆیشم بیرئەچێتەوە.

دووەم: ئەی وێنەکانیت دیبوون؟! بە لاتەوە چۆن

بوون؟!

نیشتمان: بە ڕاستی زۆر کەم. بەڵام من تێیان

نەئەگەیشتم.

(بە پێکەنینەوە) جارێکیان وێنەی پیاوێکی

نیشاندام سێ

دەم و چاوی هەبوو... ئاخر مرۆڤ چۆن سێ دەم و چاوی

هەیە؟! ها... وا نییە؟!

دووەم: بۆ نا؟! ئێمە ڕۆژانە تۆ ئەبینین لە سێ

چوار

دەم و چاو زیاتریشت هەیە!

یەکەم: ئەمە ڕاستە. من ئەو ڕۆژە لە کردنەوەی

بازاڕێکی گەورەدا تۆم بینی چوار دەم و چاوت

هەبوو

دەم و چاوێکی کوردی و یەکێکی تورکی و یەکێکی

فارسی و یەکێکی

عەرەبی.

نیشتمان: شتی وا نییە. ئەوە هەر چاوی ئێوە وام

ئەبینێ!

دووەم: ئەو ڕۆژە هەر لێرەدا بوو باسی

بەڵێندەرێکی

دەوڵەمەندی ئەم شارە کرا... تۆ ناوی خۆی و باوو

باپیری و ڕەچەڵەکیت هەر هەمووی ئەزانی و لە بەرت

بوون.

تەنانەت ناوی دایکی و نەنکی نەنکیشی... کەچی...

یەکەم: (بۆی تەواو ئەکات) کەچی ناوی شەقامێکی

گەورەی ناو دنیای هونەری ئەم شارە نازانی؟!

نیشتمان: (ئەشڵەژێ) سەرقاڵیی... سەرقاڵیی...

ببوورن

ببوورن... من ئەبێ بڕۆم... چونکە تۆزێکی تر

پێویستە بەردی

بناغەی "کۆمپانیای ئازادی" دابنێم! (ئەڕوات)

دووەم: توخوا ئەمە نیشتمانە؟! یان موقاویل؟!

یەکەم: باشتر با بڕوات!

دووەم: ئای کە ڕۆژێکی غەمگینە... ڕۆژێکی ڕەنگ

خۆڵەمێشیی...

یەکەم: چ زیانێکی گەورە بوو؟! بۆ ئەم شەقامەو

بۆ ئێمەو بۆ هونەرو بۆ جوانی و بۆ هەموو دنیایش!

دووەم: ئەی ئێمە ئەمڕۆ چی بکەین؟!

یەکەم: سەرلەئێوارەو هەر لێرەدا... ساڵیادێکی

گەورەی

بۆ ئەگێڕین... ئەو گەنجانەیش هەر هەموویان...

لەگەڵمانن...

دووەم: من بە نیازم پەخشانێکی بە

گەڵاوەریوەکانم بۆ بنووسم!

یەکەم: من شیعرێکم بۆ نووسیوە. درێژ نییە...

ئەگەر

بێزارت نەکەم هەر ئێستا حەزئەکەم بۆت

بخوێنمەوە!

دووەم: بە گوێچکەی دڵی هەموو گەڵاو پژوپۆیەکم

گوێت

لێ ئەگرم

یەکەم: "شیعرەکە ئەخوێنێتەوە. گەنجەکانیش دێنە

لایەوەو ئەوانیش گوێ ئەگرن"

***

من نیشتمانەکەم گێلە

لە خوێن ساردی و بیرچوونەوەو

بێباکیدا

لە هیچ نیشتمانێکی تر ناچێ

بۆیە منیش بڕیارم دا

وەکو کراسێکی کۆن و

چاویلکەیەکی شکاوو
نامەیەکی بزرکراو
ئەوم لەبیر بچێتەوە!
لەسەر جادەی سەهۆڵەکە ڕاوەستاوم.
یەکەم جارە ناوەکەم و خۆم و ڕوخسارم و جادەکە
لەیەک بچن. چەند ڕۆژێکە،
وەکو ئەوەی چەندساڵێ بێ، کچێک هاتۆتە ڕۆحمەوە،
بە یەکەوە لەتەک خەونێکی شینباوو بارانێکی
تازەو شەماڵێکی نارنجیدا هاتوونەتە ناو
ڕۆحمەوە. کچێک هاتۆتە چاومەوەو لەگەڵ خۆیدا
هەندێ لە چوکڵەی ئەستێرەو هەندێ لە پرژەی
گۆرانی و
هەندێ لە شنەی ئۆخژن و هەدادانی ئاواتێکی مەیلەو
سەوزی
بۆ هێناوم. کچێک هاتۆتە ڕۆحمەوە، نە فریشتەی
خواوەندێکەو نە پەرییەکی ئاسمانەو نە حۆرییەکی
بەهەشتە. کچێکی جوانی سەر ئەرزەو. قەڵبەزەیەو
لەشی پڕە لە مۆسیقاو هەر نۆتەیەو تیا
هەڵئەقوڵێ.
ناسک ناسک. لەم دیوەوە وەختێ کە تەماشای ئەکەیت
لە ناوەوە چرۆی شیعری تیا ئەبینی و لێوانلێوە لە
مانگەشەو، کاتێ ئەڕوا ئەو تریفەی لێئەڕژێ و
ڕۆژێ جلی دارهەنارێ ئەپۆشێت و ڕۆژێکی تر جلی
زەردەی ئێوارانێ و یان پۆشاکی شەپۆلانێ.

***

پرچە درێژە ڕەشەکەی ئەڵێی مەراقی دایکمەو
ڕەنگی پێستی لە جۆگەی بەر هەتاو ئەچێ و
دەستەکانی لە دەستی بەفری قەسیدە.
هێندە نابێ کچێک بۆتە نیشتمانم
لە جێی ڕووبار
من لە کەنار لەشی ئەودا دائەنیشم
لە جێی قەڵبەزەو تاڤگەیش
ئەچمە بەر کەزیەکانی ئەو.

***

پێستی نازداری ڕۆژانا
لە گەواڵەی هەورێ ئەچێ
ڕەنگ برۆنزیی
هەموو جارێ
کە سەرنجم
لە هەوری شان و مل ئەدا
ئیتر بارانی پەخشان و
خەون و ئاواز
بەسەر مندا دائەڕژێ!

***

من هێندە نابێ زانیومە
عەشق هەر خودا خۆیەتی
ئەو وەختەی دێتە ناوتەوە
ئەوسا ئیتر تۆی عاشقیش

لە سووتانیا پرشنگێکی!

نووری ئەوی!

***

ژیان، دوو چاوی ئەڵوەندی

ڕۆزانایە.

یاخود سروەی سەر دوو باسکی

دەستە نەرم و نۆڵەکانی

لە یەکەمیاندا

تۆ "گەمیەی سەرخۆش"یت و

لە دووەمیاندا تۆ ئەبی

بە ژێی تاری

نێوان سیحری پەنجەکانی!

***

من هێندە نابێ زانیومە

وەختێ کە خۆشەویستیی هات

وەختێ کە ئاوێتەت ئەبێ

لە خۆتەوەو نازانی چۆن!

زمانی دار زمانی بەرد

زمانی ئاو

زمانی زەریا فێر ئەبی و

لە دواییشدا

باڵداریت و بۆ خۆت ئەفڕی!

کە عاشق بوویت

نازانی چۆن؟ یان لە کوێوە؟

هێزێک دێتە ناو لەشتەوەو

لە خۆتەوە

بێ دەربەستی و

سواری سەری ترس ئەبیت و

لە ڕێگەی هات و نەهاتدا

بێ پەروایت و

تۆ هەر ڕێگەی نەهات ئەگری!

***

ئیستە ڕۆژانە کە بە لای

باخچەی نالی و شیعرەکانیا تێئەپەڕم

لەمسەرەوە ڕۆزانا بۆتە "حەبیبە"و

لەو سەرەوە دەم و لێوی

لەسەر پەلکی شیعرێکی کەسک

پەپوولەیە.

ئەگەر دنیا

لەم عەشقەی من و ڕۆزانای

لەناو دڵی ژن و پیاوی

سەر زەمیندا تۆو کردایە.

دڵنیا بووم

ئیتر ڕق و شەڕو تۆڵەی

تا هەتایە بە خۆیەوە نەبینیایە.

***

نیشتمان ڕۆحی منی خستبووە ناو چوارچێوەیەکی

تەنگەبەری

خۆیەوە. بەڵام ئەو کچە هات و ڕۆحی گیرۆدەی بەرەو
مەوداکانی گەردونێ هەڵفڕان. نیشتمان ئافەرۆزی
کردبووم
بەڵام دڵی ئەو کچە داڵدەی دام. نیشتمان بە
تەنها هەر
ڕابوردووی هەبوو وەلێ ئەو کچە هات و لەناو
دەستەکانیدا
داهاتووی بۆ هێنام!
***

ئەو کچە ناوی "ڕۆزانا"یە
شیعرێکە هێشتا نەخوێنراوەتەوەو چاپیش نەکراوە.
هێشتا هەر گوڵی پاک نووسە.
لەبەر دەستی خودادایەو ڕۆژ لە دوای ڕۆژ
جوانتری ئەکاو هەژدە جار پیاچۆتەوەو
هەژدە ساڵەو ئەم قەسیدەیە کۆتایی نایە!
***

"ئیلوار"ی شاعیری فەرەنسی نیو سەدە پێشتر
کە عاشقی ئازادیی بوو ناوی ئەوی لەسەر
هەموو شتێ نووسی. بەڵام من لە باتی ناوی
"ئازادی" یان "نیشتمان" یان "یەکسانی"
ناوی "ڕۆزانا" ئەنووسم:
***

لەسەر جەستەی نیشتمان خۆی ئەنووسم "ڕۆزانا"
لەسەر جەستەی شیعرو ئازادی ئەنووسم ڕۆزانا.

لەسەر باڵەکانی ئاشتی.
لەسەر باسکی (با).
لەسەر گەردنی شەپۆل.
لەسەر ناوچەوانی درەختەکان.
لەسەر گەڵا، لەسەر سنگی بەفر.
لەسەر شەقامەکان، لەسەر تەلارەکان
لەسەر جامی پێشەوەی هەموو ئوتومبیلەکان
لەسەر دیواری کۆڵانە برسیەکان.
لەسەر دەرگای ماڵان و
لەسەر شان و ملی هەموو کەژەکان.
ئەنووسم ڕۆزانا!
وێنەکەی ئەکەمە ملی نیشتمان
ئەیدەمە دەست ڕووبارو
ئەیدەم بە دەم باوە.
وێنەکەی بە چارۆگەی کەشتیەکاندا هەڵئەواسم.
بە پەنجەرەی ترینەکاندا.
بە باڵی فڕۆکەکاندا.
ناوی ڕۆزانا لەسەر هەموو ئەو شتانەیش ئەنووسم
کە ئیلوار بە خەیاڵیا نەهاتبوو ناوی
"ئازادی"یان
لەسەر بنووسێ:
لەسەر باڵی پەپوولە. لەسەر پلەی پەیژە. لەسەر
پۆپنەی
کەڵەشێرەکان. لەسەر یاڵی ئەسپ. لەسەر دیوانەکەی

ئیلوار خۆی. لەسەر کڵاوی کڵاوکوڕە. لەسەر داری
گۆڵی هەموو یاریگاکان. لەسەر شووشەی هەموو
بادەیەک.
لەسەر بەرماڵەکەی دایکم. لەسەر هیلالی
منارەکان.
لەسەر زەنگی کڵێسا. لەسەر هەموو ڕیکلامەکان.
لەسەر
هەموو کەناڵەکان و لەناو هەموو ماڵپەڕەکاندا،
لەسەر
ئەو مانگی دەستکردانەی ئەچنە فەزاوە. لەسەر
هەموو
پاکەتە جگەرەیەک. لەسەر باڵۆنەکان. لەسەر هەموو
تی شێرتەکان. لەسەر هەموو جامخانەی کۆگاکان. لە
ئاسمانی
هەموو مەیدانە گەورەکاندا. لەسەر سنگی
پەیکەرەکان. لەسەر
دیواری هەموو تونیل بانەکان. لەسەر کەناری
زەریا.
لەسەر ڕەوەزی کێوەکان. لەسەر پەلکەگیای
دەشتەکان.
لەسەر گڵۆپی هەموو ترافیکەکان. لەسەر تابلۆی
هەموو ئوتێلەکان.
لەسەر پاپۆڕە گەورەکان. لەسەر سنگی
ئاسکەکان. لەسەر ناوچەوانی هەموو پردەکان.

لەسەر بەفری قوتبەکان. لەسەر
خەتی ئیستوا. لەسەر بەرگی هەموو ڕۆمانە
جوانەکان. لەسەر سکەی هەموو شەمەندەفەرەکان
لەسەر... لەسەر... لەسەر... ناوی ڕۆزانا
ئەنووسم و
ئەنووسم و ئەنووسم!
ڕۆزانا بۆ من دنیایەو
وا ئەزانم هەموو ڕۆژێ
لە ناو چاوەکانی ئەودا
شارێکی تازە ئەبینم و
هەموو ڕۆژێ، بە سەفەرێ
ئەچمە دەرێ!
***
من ئێستا ڕۆزانا نیشتمانمە
من ئیستا لەم نیشتمانە تازەیەدا
بووم بە کەمانچەیەکی کامەران و
شەپۆل لێئەدەم
درەخت ئەژەنم!
***
ئەم کاتەتان باش!
منم "ڕۆزانا"
تەمەنم نۆزدە گوڵەباخی وەڕسەو
نۆزدە پرسیاری شپرزەو
نۆزدە مامزی یاخیی.

من هاووڵاتی "خەم لاند"م
خەم لاند لە "کیشوەری زوڵم"دایەو
ئەکەوێتە باشووری خۆرئاوای "هەژاری"یەوە
پایتەختەکەی ناوی "تەمتوومان"ەو
لە چوارلاوە ڕەشەبا دەوری داوە.
من لە گەڕەکی پاییزدا لەدایک بووم
تەنیایی مەلاشوومی هەڵداوەتەوە.
قوماتەکەم گەڵای وەریو بووە.
باوکم ناوی "بریندار"ەو
دایکیشم ناوی "خەزان"ە
لەگەڵ ڕاپەڕین"ی چاو سەوزدا
هەردووکمان لە ڕۆژێکدا چاومان هەڵهێناوە.
ئەو شیری دایکی منی خواردووەو
منیش شیری دایکی ئەو.
من زۆر دەمێکە باوکم چۆتە لای گڵ
نیشتمانی پیرۆز بە دەستە پیرۆزەکانی خۆی
بەر لە دە ساڵ
لە بەیانییەکی تەماویداو
لە پێچی مێژوویەکی شوومدا
ئەو کاتەی وڵات بووبوو
بە دەستارێکی گەورە گەورەو
براکانیش یەکترییان پێ ئەهاڕی!
لەو دەمەدا سێ فیشەکی گڕداریان لەسەریا چاند.
من لەگەڵ نان و ئاوی

کوژراودا گەورە بووم.
ئەوەندەیش نابێ
لە هۆڵێکی کتێبخانەی گشتی
بە هۆی دێڕێ شیعری "گۆران"ەوە
لەگەڵ "کامەران"دا یەکمان بینی
ئەو کورە باریکەلە قژ تەنکەی
لەسەر لێواری خۆکوشتن ڕاوەستابوو
لەو ساتەدا
یەکمان ناسی
هەر زوو ئێمە
وەک دوو دڵۆپ فرمێسک و
دوو وشەی غەمگین و
دوو گوڵە گەنمی تینوو...
دوو دەست لە کەلەپچەیەکدا...
دوو سێو لە سەبەتەیەکدا...
دوو ئاوێنە لە ڕێگەیەکدا
دوو ڕەنگی بێزار لە ڕەنگدانێکدا
یەکمان ناسی
کتێب تەوقەی لەگەڵ یەکتردا پێکردین و
کتێب خستینیە تەنیشت یەکەوە
کتێب ئاڵ و گۆڕی مەراقی پێکردین و
کتێب ڕیزێ خەون و ڕیزێ پرسیاری
نەکراوی پێ نووسین و
ئیتر چووینە ناو قولایی یەکترەوە.

ئیستا ئێمە دەستمان لەم نیشتمانە پیرە بەرداوە.
ئیستا ئێمە
خۆشەویستیمان کردووە بە نیشتمان
بۆ خەونەکانی هەردووکمان!

***

بەیانیتان باش!
من ناوم کتێبە
هەزاران هەزار دەم و چاوو هەزاران هەزار
وڵات و دڵ و دەروونم هەیە.
جاری وا هەیە پڕم لە خۆشەویستی، لە لێبوردن،
لە بەزەیی، لە عەقڵی ڕووناک، لە ئازادیی
جاری وایش هەیە پڕم لە ڕق و لە بوغزو
لە تۆڵەو تاریکیی...
گەلێ جار بە دەنگێکی گڕ ئەدوێم و
گەلێ جاریش بە دەنگێکی ناسک
جارێ مێم و جارێ نێرو
زمانم سەدان زمانەو
پێناسەیشم لە هەزار ڕەنگ.
من سەرینم پەنجەکانی هەردوو دەستەو
وشەو دێڕو لاپەڕەیشم عاشقی چاو.
ئەو وەختەی منت بە دڵ بێ
ئەبمە جوانترین هاوڕێت.
لەوانەیە ئاگری شەڕم خۆشکردبێ و
لەوانەیشە بووبم بە ئاسمانی ئاشتی...

من لە قوڕەوە کتێبم
هێندەی "گلگامش"یش کۆنم...
من نەبوومایە ژیان کوێر ئەبوو
سبەی نەئەبوو... مێژوو ون ئەبوو
جاری وا هەیە ئەستوور ئەستوورم و
جار وایش هەیە باریک باریک.
ئەمڕۆ کۆترێک هات بۆ لام
دەنووک بە خەندەو چاو ڕووناک
وتی: وەرە، کتێبخانەیەک خۆشەویست
کتێبخانەیەک بەخشندە بانگت ئەکات.
خاوەنی ئەم مەکتەبەیە: هەتاوێکی خوێندەوارە
نە خورافات ئاسمانێتی و نە مقەستیش سانسۆرێتی
بەڵام پاسەوانێکی عاشقی وەک تۆی ئەوێ
تا کۆترەکان و وشەکان و وێنەکان نەدزرێن.
***
من ئێستاکە دە ڕۆژ زیاترە وام لەناو مەملەکەتی
ئەم هەتاوە بەرینەدا، عەشقی ڕۆزانام تێکەڵی
ئەم دەغڵ و دانی کتێبانە کردووە. من هەست ئەکەم
لەم شوێنەدا هەموو ڕۆژێ: ڕووبارێکی تازە.
باخچەیەکی
تازەو فڕینێکی تازە فێر ئەبم. من هەست ئەکەم
هەموو
ڕۆژێ تارماییەکی مێژووی کۆن، خێوو دێوو درنجێکی
درۆی دیرۆک بەجێدێڵم. هەموو ڕۆژێ تیشکێک

له ئایندەدا ئەچێنم و ئەسپی خۆرێک ڕام ئەکەم و
ئەیکەم بە مزگێنی ڕێگا! هەموو شەوێکیش شیعرێکی
جوانکیلەی
وەکو ڕۆژانا لەسەر ئەم جەستە ماندووە
هەڵئەکەنم!

***

"هەندێ لەو شیعرە وردو بچووکانەی کە لە شەوانی
پاسەوانیداو لە عەمباری کتێبەکانداو لەو
دە شەوەدا نووسیمن!"
یەکەم شەو
زەوییەک بووم
سخار... سخار
ڕەش و بەدبەخت
وام دانابوو لە دواییدا
یان کوندەپەپوو بمکڕێ
یان گۆڕستان!
وەلێ ڕۆژێ عەشقی کیژۆڵەیەک هات و
ڕەشی کردەوە بە سپی و
کچیش خۆی کرد بە ڕێژنەو
گوڵی باران!

***

دووەم شەو
کە بانگت کرد شیعر نایەت
با سەد دەرگایش لەبەردەمیا بکەیتەوە

ئەو وەختێ دێ بانگ نەکراوەو
چی دەرگایشە داخراوەو
بەسەر حەساردا بازئەداو
لە درزێکی باریکەوە
دێتە ژوورێ!
***

سێیەم شەو
هەزار ماچی نیشتمانەکەی خۆم کردو
ئەو یەک ماچی نەکردمەوە.
بە زۆر نییە
خۆشەویستیی ئالا نییە دروستی کەم
یان تابلۆیەک بیکرمەوە.
***

چوارەم شەو
ئەو وەختەی کە بووی بە عاشق
عەشق ئەتکا بە شمشاڵ و
ئەتنێ بە لێوی خۆیەوە
ئەوسا ئیتر تۆ دلۆپی حەسرەتیت و
لە بەردەمی ماشقەدا
وردە وردە ئەتوێیتەوە!
***

بە بێ ئەوەی پێبزانێ
عاشق سەری خۆی داوەتە
دەست نادیارێ

جارێک ئەبێ بە گەواڵەی
شێت و وێتی کەنار زەریاو
جارێکی دی
بە باگژەی نیوەشەوی
جادەی شارێ!
من ئەوەندە بەسەر عەشقی
ڕۆزانادا نوشتامەوە
ئەوەندە سەیری چاویم کرد
تا تەنیاییم بووە بە هەڵم و
هەڵم بە گۆمی ئیلهامی و
لە دواییشدا
بە ئێجگاری
خۆم و شیعرم تیا تواینەوە!
***
پێنجەم شەو
شەوانی تر بە دەم درۆی
سەوزو سوورو
بەڵێنی ترش و شیرینی
ئەو نیشتمانەی خۆمەوە
نیگاکانم ئەچوونە خەو.
کە ئەنووستم خەوەکانم لەناو خەودا
ئەهاتنە دی.
بەڵام وەختێ کە بەیانیان هەڵئەسام و
چاوەکانم ئەکردەوە

جگە لە تراویلکەیەک
ئیتر من هیچم نەئەدی!
***

شەشەم شەو
ئەمشەو لەناو عەشقی ڕۆزانادا گریام
جیاوازیی فرمێسکی خۆشی و
فرمێسکەکانی دڵ تەنگیش هەر ئەوەیە
لەگەڵ فرمێسکی یەکەمدا
پەڕەی گوڵ دێنە خوارەوەو
لەگەڵ فرمێسکی دووەمدا
وردە پشکۆ!
***

حەوتەم شەو
کوا ڕۆزانا؟!
لەم عەمبارە گەورەیەدا
هەموو هەواڵی ئەپرسن
قەڵەم، کاغەز، وێنەکان و
کتێبی سەر ڕەفەی دیوار
تەنها چەند کتێبێ نەبێ
چارەی ڕۆزانایان ناوێ
لەبەر ئەوەی بێ حیجابە!
***

هەشتەم شەو
یەک دڵۆپ عەشقی ڕۆزانا، گۆمێک بۆ من دروست

ئەکاو
منیش بۆ خۆم بەلەمێکی چارۆگەداری خەیاڵی ئەخەمە
ناو
بۆ ئەوەی هەتا ئەوپەڕی تخووبەکانی قەسیدەو
پەخشان
بمبا!
برژانگەکانی ڕۆزانا، ئەبنە پەلکەگیای دەفتەرم و
منیش هەرچی پەپوولەی ناو شیعرەکانە لەو مێرگەدا
یەکە یەکە بەریان ئەدەم!
یەک نینۆکی ئەکەم بە شانۆی ئەم عەشقەو
لەسەر تەختەی بچکۆلانەی ئەو شانۆیە
شانۆنامەی ڕۆمیو جولیت بە گچکەیی نیشان ئەدەم!
یەک تاڵە قژی ڕۆزانا ئەکەم بە پردی سەر ئاوی
خۆشەویستیی و دوا دەقیشم بە ڕێبواری!
هەتاکو نیگا نەگۆڕین
تەماشاکانیش ناگۆڕدرێن.
تا گەواڵەی ناو ئەم سەرە
وەکو خۆی بێ
بارانی تازە نابینین!
***
"ئێمە هەردووکمان، من و ڕۆزانا، لەسەر
ڕەوەزی خۆشەویستیی ڕائەوەستین و بەو بەرزەوە
سەرلەنوێ پرشنگەکان لە هێڵەکی سەر ئەدەینەوە.
لە یەکەمین هەنگاوی سەر شەقامی گومانەوە دەست

پێئەکەینەوەو شارایەک پرسیار لەگەڵ خۆماندا ئەگێڕین.
سەرلەنوێ وشەو دەستەواژەو ناوو ئاوەڵناوەو زاراوەکان بە هەللاجیەکەی خۆمان شی ئەکەینەوە. ئەم مێژووە ڕووت ڕووت ئەکەینەوە، لە نووکەوە بە قسەکانیدا ئەچینەوە. ئێمە سەرلەنوێ لە شاخ ئەپرسینەوە: کێ ئەڵێ تۆ قارەمانی؟! بە بەفر ئەڵێین: کێ ئەڵێ تۆ پاکی؟! بە سروودەکان ئەڵێین:
کێ ئەڵێ ئێوە پیرۆزن؟!"

***

"ئەزانین هەردووکمان ئەزانین
ئەم عەشقی ناو زەریای نەهاتە
شەپۆلی یاخییەو سەری خۆی داوەتە
دەست (با)یەک کە مردن لە وژەو گڤەیدا
گەرداوی بە پێوە وەستاوەو
قەدەری بەندەری تەماویش
خوایەکی زۆر تووڕەو بێباکە!
ئەزانین هەردووکمان ئەزانین
ئەم عەشقە، باڵندەی شیعرێکی
کۆچەرو بێکەسەو بە تەنها دوو پرشنگ باڵێتی و
پەڕەی گوڵ چاوێتی و
هێلانەوماڵیشی گەواڵە هەورێکی
گەڕۆکی غەمناکە!

***

ئەزانین هەردووکمان ئەزانین

وەک تۆوی دەم باهۆز سەفەرمان سەفەری

ناو خەونی پەرت پەرتە و هەر ڕۆژەی

لە باوەشی وەرزێکی نادیاردا جەستەمان

کڵۆکۆی عەشقێکی سوتماکە!

دڵم ئێستا لە نیسانی گۆڕاندایەو

هەموو ڕەنگەکان پێکەوە وان لە چاوداو

بینینەکانم شکۆفەی تازەترین

گۆرانییان دەرکردووە!

***

لە دەفتەردا

دەستەواژەم بوون بە جۆگەو

چی خەیاڵی کورتەباڵاو بچوکیشمە

لەم مێرگەدا

ئەوا ئێستا هەموو کەوتوونەتە باڵا!

***

ڕۆزانا... ڕۆزانا

کەمانچەیەک ویستی لەگەڵ لەنجەولاریا بڕواو

جوانیەکەی ئەو پەردەپۆش کات

بەڵام پێ و پلی ژێکانی لە یەک ئاڵاو

لە حەسرەتدا بە دەمدا کەوت!

ئەگەر خۆشەویستیی نەبوو

با نەونەمام یاخود خونچەو کانیی گەنج و

قەڵبەزەی هەرزەکاریش بی
با لەشیشت ژووری گوڵ و ئینجانە بێ
وەختێ زانیت شەوی تەنیایی و بێزاریت
بەسەردا دێ و تاریک ئەبی!
***

نۆیەم شەو
من کە شیعر بۆ سیاسەت ئەنووسم
لەو وەختەدا ئەبم بە گوڵدانە گرژو مۆنەکانی
سەر مێزی کۆبوونەوە.
ئەگەر بۆ خۆمی بنووسم
ئەبم بە جۆگە ئاوێکی ڕاستەقینە.
کە بۆ ئەم نیشتمانەی ئیستای بنووسم
ئەبم بە ڕیزێ ژمارەی دزراو.
بەڵام وەختێ کە بۆ ڕۆزانای بنووسم
ئەبم بە جوانترین شیعری دنیا!
***

دەیەم شەو
دوێنێ شەوێ هەندێ کتێب
مێزگردێکیان لەسەر مێزەکەم دروستکرد
سێ کتێب بوون
کتێبێکی زەمانی پێغەمبەرو
کتێبێکی زەمانی "کانت" و
کتێبێکی زەمانی "مارکس"
تەوەری باس

لەسەر دین و عەدالەت بوو
یەکەم کتێب ڕیشنێکی کەڵەگەت بوو
سەعاتەکەی لە بری چەپ
کردبووە دەستی ڕاستیەوە
وەختێ دووا
خوداو پێغەمبەرو هەر چوار خەلیفەکەی خستە سەر
مێز.
هەرچی سورەت و ئایەتە خستیە سەر مێز.
مێزەری والی و ئەمیری خستە سەر مێز.
کڵاوەکەی سەخری جنی خستە سەر مێز.
فێستی قازی و چی مێزەری شەریعەتە
خستیە سەر مێز.
بەڵام ئەوەی کە نەیخستە سەر مێز
سەرە بڕاوەکانی ئاوایی حەمەو
ئەوەی نەیهێنایە سەر مێز
چاوەکانی یەکی شوباتی هەولێرو
دەستی قرتاوی شەنگارو
قاچی پەڕیوی کەرکووک و
لەشی بێ سەری سۆماڵ و
سەری بێ لەشی عێراق و
مانگی جەستەی پارەپارەی
جەزایر بووا!
***
لەسەر جادەی سەهۆڵەکە ڕاوەستاوم

تەماشاکانم پڕپڕن لە دوارِۆژو
لە ڕۆزاناو لە مانگەشەو!
هەوا سەوزە. ئەو شاخانە بەرزترو
ئاوێنەی شیعر جوانترو بێگەردترو لەشی منیش
بووە بە دەشتی ئاوازو هاژەی بەستە!
شنەبایەک هاوڕێمەو سەرنجەکانم پەروانەو
ئەچمە دەرێ. ئەم کۆڵانە کۆڵانەکەی ئەوسا نییەو
کۆڵانێکە بۆ پیاسەکانی شمشاڵ و
بۆ ماچەکانی قەڵەم و
بۆ جێژوانی قەسیدە!
نازانم بۆ؟!
بەڵام ئەو وەختەی کە شیعرێ
بۆ یەکەم جار باوەش ئەکات
بە ئاوازێکی تازەداو
گۆنەی تەڕی هەڵئەمژێ
من ڕۆزانام دێتەوە بیر؟!
نازانم بۆ؟!
بەڵام ئەو وەختەی فڕینی
جووتە مەلێ
بۆ یەکەم جار لە ئاسۆیەکی تازەدا
مل هەڵئەسوون لە داوێنی پەڵەهەورێ
من خۆم و ڕۆزاناو عەشقی
هەردووکمانم دێتەوە بیر؟!
من نازانم؟!

"له شەوی یانزەهەمیشدا خەوم لێنەکەوت، تا ئەم
پەخشانە، بۆ خۆشەویستیی ڕۆزانا، له باوەشما
نەرِسکاو
باوەشی پیا نەکردم!"
***
تۆ ئەزانی خۆشەویستیت، لەم مەملەکەتی پەرچووەدا
بە دەستە ئەفسووناویەکانی، جێگۆڕکێ بە کات و
شوێنم
ئەکات و لەناو یەکتریدا ئەیانتوێنێتەوەو
سەرلەنوێ
جەستەی من تێک ئەداتەوەو ئینجا ئەیخوڵقێنێتەوە.
ساڵم
ئەباتەوە دواوەو گەڵای وەریوم هەڵئەگرێتەوەو
ئەیباتەوە سەرچڵ و سەرلەنوێ ئەویش سەوز
ئەبێتەوەو
نەرم نەرم جارێکی دی ئەشنێتەوە.
تۆ ئەزانی لەم فڕینە تازەیەدا، ئەوەندە
بەرزەفڕم،
ئەوەندە بەرزبوومەتەوە، خەریکم دەنووک بدەم
لە شووشەی پرشنگی ژوورەکەی خودا!
***
تۆ ئەزانی لەم زمانی خۆشەویستیەدا.
لەم فەرهەنگە زیوینەدا. نە وشەی "ڕق"ی تیایەو
نە "ئاوابوون" و نە "ماندووبوون" و نە

"وەرین" و نە "کوژانەوە" و نە "پیربوون".

***

تۆ ئەزانی خۆشەویستیت... ئەڵێی تەوژمی بە
لرفەلرف و
کەف چرێنی ڕووباری نوورێکە کە لە دڵی خواوە، لە
چاوەکانی
خواوە، سەرچاوە ئەگرێ و لەو گەلیی نەهێنی و
وزەی غەیبانەوە دێت و بە دەم هاژەهاژێکی
بەزایەڵەوە
سەربەرەو خوار ئەبیتەوەو ئینجا بە لووزەو
ئەرژێتە ناو
دڵ و چاوی منەوەو منیش ئەوسا چیم بوێ ئەبم
بەوە؟!
درەخت، باڵندە، پرشنگ، باران، کلووی
بەفر یان دەنکە تەرزە؟! چۆنم بوێ ئەبم بەوە. بە
پەپوولە،
پەلکە گیا، شەونم، گەڵا، یان بە گۆرانی و بە
مۆسیقاو
بە قەسیدە؟! چۆنم بوێ ئەبم بەوە؟! ئەو بەیانییە
بووبووم
بە هەنگەزەردەیەکی شپرزەو، بەنێو شەبەنگەکانی
هەتاوو سێبەرو سنگ و بەرۆکی
تەلان و باخەکاندا، ئەگەڕام بۆ ئەوەی خۆشترین
بۆن کۆکەمەوەو

له دواییدا بیانكەمە ناو شووشەی ڕەنگینی
شیعرێكەوەو شیعرەكەیش
بدەم بەو كچە! ئەو ئێوارەیەیش بووبووم بە
نەورەس زەنگۆڵ
زەنگۆڵ ئاوی زیوینم لێ ئەچۆڕایەوەو باڵەكانم
زەردەی بە ورشەو
پرشەی ئێوارانیان تێدا ئەدرەوشایەوەو دەنگیشم
ئەو ژێی
وردە شەپۆلانەی لەگەڵ خۆیدا هێنابوو بۆ ئاسمان
كە پێڵووی عاشقان
ئاوازژەنی بوون!
تۆ ئەزانی خۆشەویستیت! بوونێكی نوێ و مانایەكی
نوێ و
ڕەنگێكی نوێی بە خۆم و هەموو شتەكان بەخشیوە! نە
ڕۆژەكان.
ڕۆژە، مرۆ مۆچەكانی دوێنێن و نە شەوانیش شەوە
نائومێدو
كۆماوە و دەست لەسەر ئەژنۆكانی دوێنێن! من ئێستە
(زمان)
لە دەفتەرما تەیرێكی ماڵییەو هەنگاوەكانم
چۆنیان بوێ ڕێ و
بان و شەقام بەو جۆرە لەگەڵ خۆیاندا ئەبەن و
چاوەكانم چۆنیان
بوێ بەو جۆرە ڕەنگەكان ڕام ئەكەن و دەستەكانیشم

چۆنیان بویَ

هەر بەو جۆرە تیشکەکانی ئایندە ئەگرن! تۆ

ئەزانی خۆشەویستیت!

پەنجەرەیەکە لە پەنجەرەکانی تەماشای خواو

بەسەر دارستانی شیعری مندا ئەڕوانیَ!

***

تۆ ئەزانی ئەم پەخشانەم بەچی و چۆن نووسیوە؟

بە قەڵەمی تیریژێکی سەری یەزدان. "با" خەیاڵم

بووەو

ساماڵ کاغەزو، ئەستێرە شووشە مەرەکەبم و،

پەڵەهەوریَ مێزەکەم و، گویگریشم دڵۆپەکانی باران!

تۆ ئەزانی؟!

***

"پێریَ لە کتێبخانەی گشتی کە "ڕۆزانا"م بینی

بەشێکی زۆری

قسەکانمان سەبارەت بە شیعری تازەو نموونە

جوانەکانیان بوو. ڕۆزانا

وتی: بە ڕاستی من ئەو شیعرانەم بە دڵە کە

ئاهەنگ و ڕیتمێکی

موسیقیان تێدایە... بە تایبەتی شیعری لیریکی...

هەندیَ شیعری ڕۆمانسیش

هەن قەت لە بیرم ناچنەوە. نازانم تۆ شاعیری

بەڵام هەوڵت

داوە لەو شیعرە ڕۆمانسیە ئاهەنگدارانە بنووسی؟!

ئیتر دواتر ئەو
پرسیارەی ڕۆزانا بوو بە مەراق لە دڵما... ئەو
ڕۆژە نەهاتمە دەرەوە
خەیاڵ بردمی دوور دوور بردمی... دیارە خەیاڵێ
کە باڵەکانی
خۆشەویستیی ڕۆزانا خۆی بوون. ئیستە شیعرەکەم
تەواو کردووەو خواخوامە
ڕۆزانا ببینم و بۆی بخوێنمەوە... تۆ بڵێی بە دڵی
بێت"
***

من ئیستاکە، لە جۆلانەی، تانگۆیەکی سپیدا
دێم و دەچم و، سەرم لەسەر، شانی مانگێ داناوە
لە ئاوڕیا، تاڵەکانی، تریفەی قژ لەسەر ڕووم
پەخشانێکە، دێڕەکانی، بە پەنجەی خوا نوسراوە.
***

بە ئەسپایی، دەستی ئەگرم، وەکو دەستی شەماڵ بێ.
کەمەرێکیش، نەرم و نیان، ئەڵێی کەمەری ئاوە.
لەمسەرەوە، وەختێ ئەمبا، نەورەسی سەر شەپۆلیم
لەو سەرەوەیش، کە دێمەوە، قەترەم بەسەر گەڵاوە.
***

گەمیەی تانگۆ، هەردووکمانی، لە ئامێزدایەو
ئەڕوا
شەپۆل شەپۆل، تا ئەگاتە، کەناری شانۆی گەورە.
لە سەرەوە، بۆ خوارەوە، ئاوێنەبەند، تیشکی زۆر

بوون بە جۆگەی، هەزار ڕەنگ و، ئەڕژێن بە
سەرماندا.
***
پێستی بەفرە، کەچی دەستم، لەسەر پشتی نیوەڕووت
دائەگیرسێ و، گەرم گەرم، وەکو بووبێ بە مۆمدان.
قنج ئەبمەوە، لێوی نزیک، قوتە... بۆ ماچێکی ئاڵ
یەک چرکەی تر، یان نوقم بووم، یان فڕیوم بۆ
ئاسمان.
***
بەر گەردنی، ئاوێنەیەو، لەگەڵ مندا ئەسووڕێ
جارێک خۆم و، جارێکی تر، هۆنراوەی تیا ئەبینم.
بەرەو خوارتر، لە درزێکدا، تەماشام عاسی ئەبێ
بەر نابێ تا، دوو سێ پەنجەم، کۆترەکان
هەڵئەفڕێنێ.
***
من ئەمشەوم، هێناوەتە، بەربارانی تانگۆوە
بۆیە تەڕە، ڕووناکیم و، وا سەوزیشە مۆسیقا.
ئەجووڵێم و، بە ئاگام و، کەچی لەناو خەویشدا:
بووم بە ئاسۆی، ناو سایەقەو، "گەلاویژ" لە
باوەشما.
***
ئەو باڵایە، باڵای تیشکە؟ یاخود باڵای قەسیدە؟
ئەو قۆڵانە، قۆڵی کچن؟! یاخود قۆڵی گۆرانیی؟.
ئەی من ئەمشەو، ئاگر خۆیم؟، یاخود هەڵمی سەر

ئاگر؟.

فڕین خۆیم؟، عەشق خۆیم؟، یان دڵداری باڵندە؟.

***

لە ئیستەدا من و نیشتمان لە یەکتری دابڕاوین

لە یەکتری جوێ بووینەتەوە. وەک دابڕانی

دەربەندێ

لە چیایەک. وەک جیابوونەوەی نێوانی شاخ و داخێ

بە خەرەندی. لە ئیستادا من و نیشتمان تەواو

تەواو

لە یەکتری دابڕاوین. لە ڕۆحەوە دابڕاوین. لە

لەشەوە

دوو کەرت بووین و بە یەکتری ناگەینەوە. بووین بە

دوو

لای پردێکی ناوقەد داڕووخاو. من کەوتوومەتە

ناو دۆڵی بیرچوونەوەی ڕۆژمێرێکی ئەوەوەو ئەویش

بەو ئاسمانەوە تەکەی دێ و هەر خۆی لەگەڵ خۆیدا

ئەدوێ!

***

باخێکی ڕاپەڕین وتی:

ئەو نیشتمانەیان گوزەشت

کە ڕۆژ نەبوو یەکتریمان تیا نەدیایە.

کە ڕۆژ نەبوو من ماچێکم نەکردایە

کە ڕۆژ نەبوو بەیانیان زوو

چەپکێ گوڵم بۆ سەر مێزە بێگەردەکەی نەبردایە.

خونچەیەکی زیقاوڵە ئەویش وتی:
ئەو نیشتمانەیان گوزەشت
وەکو ئەڵێن. ئەگەر ڕۆژێ
کانییەکی خۆی نەدیایە
ئەبوو بە باخی تەم گرتوو
ئەبوو بە دەشتی بێتاقەت.
ئەو نیشتمانەیان گوزەشت
-من نەمدیبوو- وەکو ئەڵێن:
کە هێشتا فێری درۆو دەلەسەو
قاچاغچێتی سەر سنوورەکان نەببوو
فێری بەرتیل وەرگرتن و گۆڕینەوەی
خوێن بە چەک و فێری چنینی دێوجامەی
دیبلۆماسی و سەمای ورچ و مەیمون ئاسای
ناو کۆنگرەکان نەبووبوو.
***
من لە وڵاتی بێ وڵاتدا لەدایک بووم
لە دووکەڵدا چاوم پشکووت
لە دەست ڕێژدا گوێچکەکانم کرانەوە
بە دەم زریکەوە پێم گرت
هەرزەکاریم وەک ئاوی ترساو ئەرۆیشت و
وەک گوڵێکی نادڵنیا شەوان ئەنووست.
ئەوەی یەکەمجار بەیانیان ئەیوت: ڕۆژباش
برسێتیی بوو
ئەوەی یەکەم جار شەوانیش ئەیوت شەوباش

ترس و بیم بوو!

***

"ئەو ساڵانە لە دەفتەرە بچکۆلەکەی مندا
ژیان بریتی بوو لە (با)یەکی تەپ و تۆزاوی و
لە خەوبینینی خۆڵاوی و لە پەنگ خواردنەوەی
تەنیایی لە یەک ژوورداو. لە دەرەوەیش
لە جەنگی نێوان مەچەک و پەنجەکانی شاخەکاندا
مێژوومان دارەمەیتێکی خوێناوی ئەبەدی بوو.
هەر لەو گەڕەکەی ئێمەدا پەنجەرە پەنجەرەی
ئەکوشت. درەخت درەختی ڕاوئەنا. گەڕەک
ئەبوو بە سیخوڕو هەنگاوی ڕێبواری ئەژمارد.
ڕەنگ ڕاپۆرتی لە ڕەنگ ئەدا. گوڵدانەکان
یەکترییان وێران ئەکرد. من نیشتمانی پیرۆزم
وەها بینی و وەها ناسی. لە دەفتەرە
بچکۆلەکەی مندا. ناوی حزب و دووکەڵ و چەتەو
ڕەنگی مردن و قوربانیی تێکەڵ بووبوون.
لە یەک جوێ نەئەکرانەوە. دوو سێ جاریش
خودا بۆ خۆی کەوتە بەینی ئەو تەورە
دەم تیژانەوەو بەڵام دوایی لەو سەرەوە
ئەویش بە دەستی بەتاڵ و نائومێدی گەڕایەوە.
لەو دەمەدا کە نیشتمان هێشتا جوان بوو.
ئەو بەردەی لەسەر ئازادیی کانیاوێ
دەستی چەپی خۆی دانابوو. ئەمجارەیان کە هاتەوە،
بە دەستی ڕاست دزی لە گۆمەکان ئەکرد.

ئەو دارگوێزە جەنگاوەرەی لەناو دەربەندێکی
تەنگدا،
شوێن مردن کەوت و ملی گرت، کێ نەیبینی
کە وەختێکیش گەڕایەوە لە بەردەمی بانکەکاندا
بە هەزار پەل خۆی بائەداو سەمای ئەکردا! ئەو
پڵنگەی کە یەکەم ڕۆژ خۆیکرد بە ناو مەرگە
سوورەکەی ئێرەدا. لە کراسێکی خەت خەتی ڕەش و سپی
بەری خۆی و لە جووتێ پێڵاوی لاستیک بەولاوەتر،
هیچی نەبوو، ئەوا ئەمڕۆیش پێڵاوی لاستیک
زێڕینەو ئەوا ئیستەیش ڕووبار ئەکڕێ و
شاخ ئەفرۆشێ و ئەیەوێ دەریاچە قووتداو
تەماعی کردۆتە مانگ و داوا ئەکا بۆی دابەزێ!"
***
ئەم کاتەت باش!
من ناوم "ڕیشۆڵە"یە
لە دەمێکەوە لەو شاخ و داخانە
تەتەری هەڵۆو بازە نێرەکان و
نامەبەری نێوان شەقامەکانی شارو
کێوەکان بووم. ئەوەندە هاتم و
چووم. هەتا باڵەکانم سواو کەسیرە بووم.
وا ئیستەیش گەڕاومەتەوە شارو
نە هەڵۆی پیرو نە هەڵۆی گەنج و کەس هیچ کەس
منیان هەر لەبیر نەماوە
کەس هیچ کەس

تەماشاکە! چش لە باڵم
بەڵام وا خەریکە ڕسوا ڕسوا
لەم سەقفی ناو گەراجەدا
لە برساندا بۆ خۆم بمرم!
***
لەسەر جادەی سەهۆڵەکە ڕاوەستاوم.
ئەو ئەلبوومەی ئەوسا ئێوە دیوتانە. من نەمدیوە.
من ناتوانم باوکێکم خۆشبوێ. تاقە یەک
زەردەخەنەی
بۆ نەگرتبم. بە منداڵیش یەک نوقڵی نەخستبێتە
گیرفانمەوە. یەک جار لەگەڵ خۆیدا نەیگێڕابم.
سواری
چەرک و فەلەقێکی نەکردبم. میزەڵڵانێکی بۆ
نەکڕیبم.
شەو بەر لە نووستن حیکایەتێکی بێ کەڵبەی بۆ
نەکردبم. من
ناتوانم مێژوویەکم خۆشبوێ هەر بۆنی بۆ کرووزی
پرچ و
جەستەی ژنی لێبێ. ناتوانم ئاوێنەیەکم خۆشبوێ
بچمە بەری کە شەوو ڕۆژ ئەلبوومەکانی خوێن و
تۆڵەم
نیشانبدات. ناتوانم باوکێکم خۆشبوێ لە پێناوی
ڕابوردوودا
بژی و بمرێ. من ناتوانم نا. ناتوانم!

من ئیستا نیشتمانی خۆم دۆزیوەتەوە
نیشتمانی تازەی من کچێکە لە نیشتمانە پیرو
عەبوسەکەی
ئێوە ناچێت. بۆ ئاو ئەڵێن ڕوونترین ئاو
لە چاوەکانی ئەودایە. بۆ درەخت و بۆ گیاو گوڵ و
زنویر ئەڵێن هەمووی لە جەستەو لە باڵاو لە شان و
مل و گەردن و نێوان مەمانی ئەودایە. من ئیتر
نامەوێ
لەو نیشتمانە بێ خەونەی ئێوەدا بژیم. من ئەمەوێ
بچمە ناو گەردوونی ڕەنگاڵەیی ئەو کچەوە. ئەو
سیحرەوە،
لەوێدا خەو ببینم. لەناو ئەودا شیعر بنووسم.
لەناو
ئەودا بخوێنمەوەو هەر لەناو ئەویشدا پیاسە بە
کەنارەکانی
دڵنیاییدا بکەم. لەودا پاڵ بکەوم و چاو ببڕمە
بارینی بەفرو پەپوولە پێکەوە. دەست لە
خۆشەویستیی بدەم و
بۆنی بکەم. ئەمەوێ بچمە ناو قۆزاخەی ئاشتییەوە
لەوێدا بژیم و بمرم.
بێزار بێزار بێزار بووم. لەو هەموو تیغەی
سەربڕین.
لەو هەموو ڕەشەبای ڕقە. لەو هەموو دارستانی
تۆڵەیە. بێزارم بێزار لەو هەموو حیکایەتە ژەنگ

گرتووانەی کە هەر لە منداڵییەوە گوێیان
تەفرەدام.
چاویان لێ دزیم و
هەستیان بە سڕبوون سپاردم!
***
من چیم ئەویست لە نیشتمان
جگە لەوەی کە نانێک و کە کونجێکی
دڵنیایی و گیرفانێکی بەحورمەت و مشتێ
هەتاوی ئارام و بارانێکی خۆشەویستیی و
پەنجەرەیەکی کراوەی سەر ئازادی و عەشقم
باتێ.
من چیم ئەویست لەوە زیاترو نەیدامێ!
بۆیە ئیتر نیوە شەوێ
دەروازەکەیم شکاندو چوومە دەرێ
بە ئێجگاری چوومە دەرێ!
***
ئێوارەیەو لەسەر جادەی سەهۆڵەکە ڕاوەستاوم
نیشتمانی کۆن خەریکە دابچێت و ئاوا بێ
تۆزێکی تر نیشتمانە تازەکەی خۆم
"ڕۆزانا" هەڵدێ و پێکەوە
وەک دوو پرسیاری نێرو مێی
تازەو تینوو
کەڵەگەتتر لە دروشم و لە منارەو
چون (با)ی بێباک لە دیوارو

له جوگرافیای حەرام و
دیرۆکی ترس.
هەر دوو بە جووت
قۆڵ لە قۆڵی یەکتریدا
گوڵ بە دەم و
هەتاو لە چاو
سەر بەرەو ژوور ئەبینەوە
بۆ ئەو باخچەی عەشق و خەونەی
نە زەرد ئەبێ و
نە پیر ئەبێ و
نە ئەیشمرێ!